ئەندەرس یاگەرسکوگ

# ئاوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

## سەرچاوەی کێشەیە یان هاوکاری؟

وەرگێڕانی

غازی عەلی خورشید

دەزگای توێژینەوە و بڵاوكردنەوەی موكریانی

● ئاوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

سەرچاوەی كێشەیە یان هاوكاری!

● نووسینی: ئەندەرس یاگەرسكوگ
● وەرگێڕانی: غازی عەلی خورشید
● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
● بەرگ: مەریوان زەندی
● ژمارەی سپاردن: ٩٣٧
● نرخ: ١٥٠٠ دینار
● چاپی یەكەم ٢٠١٠
● تیراژ: ٥٠٠ دانە
● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی كتێب (٤٢٦)

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



## ناوەرۆك

## پێشەکی وەرگێڕ

ئەم نامیلکەیە باس لەو کێشانە دەکات کە پەیوەستن بە ئاو، بە تایبەتی ئاوی زێی ئوردن کە دەکەوێتە نێوان ئیسرائیل و سووریا و لوبنان و ئوردن و دەستەڵاتی ئۆتۆنۆمی فەلەستینەوە. ئاوی ئەم زێیە، کە دەکرێت بەراورد بکرێت لەگەڵ زێی گەورە لە کوردستانی لکێندراو بە عیراق، گرنگییەکی ژیانی بۆ ئەم وڵاتانە هەیە. نووسەر ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئاو لەم دەڤەرە وشکانییەدا بەرەو کەمبوون دەچێت، لە هەمان کاتدا لە ئەنجامی پیسبوونەوە چڵۆنایەتی ئاوەکەش خراپتر دەبێت. زۆربوونی ڕێژەی دانیشتوان و ناکۆکی نەرێتی و نابەرامبەری تای تەرازووی هێزەکانی نێوان نەتەوەکانی ئەم دەڤەرە و گرفتەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی نێوخۆ و نێوان ئەم



وڵاتانە تاکو دێت پرسی ئاو بایەخدار- و هەستیارتر دەکات. یەکێك لە پێشنیارە پێشکەشکراوەکانی چارەسەرکرنی کێشەی کەم ئاویی دەڤەرەکە راکێشانی بۆری ئاوە لە تورکیاوە بۆ ئەم وڵاتانە. هەڵبەتە خوێنەر تێدەگات کە مەبەست ئاوی دیجلە و فوراتە کە سەرچاوەکانی لە کوردستانی لکێندراو بە تورکیا دایە. ئەمەش دەبێت بە هۆکاری خراپترکردنی ئاستی گوزەرانی کۆمەڵگای کوردی ئەم بەشە. هەروەکو چۆن نەوت بوو بە مایەی کاولکاری و کوشتن، دەکرێت ئاوی کوردستانیش کورد و کوردستان بە هەمان ئاقار بەرێت ئەگەر ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوە نەبین.

The next war in the Middle East will be struggled "
"over water

(میر بن-میر سەرۆکی پێشوو لە وەزارەتی کشتوکاڵی ئیسرائیل)

## پێشینە

دوای دەستگوشینی ناچاوەڕوانکراوی هەردوو ڕکەبەری یەکتری، ئیسحاق رابین سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل و یاسر عەرەفات سەرۆکی ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین PLO، لە ١٣ی سێپتەمبەری ١٩٩٣ لە واشنتۆن، پرۆسەیەکی ئاشتی لە نێوان ئیسرائیل و فەلەستین بەڕێوەچوو. کەمتر لە ساڵێك دوای مۆرکردنی پرنسیپەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیەی نێوان ئیسرائیل و PLO، کە پتر بە ڕێککەوتننامەی ئۆسلۆ دەناسرێت، ئیسرائیل و ئوردنیش گەیشتن بە پەیمانێکی ئاشتی و کۆتایی بە "باری شەڕ"ی نێوانیان هێنا کە لە ڕۆژی دروستبوونی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨ ەوە هەبووە. تەنانەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٩ یشدا پرۆسەی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و سووریاش خێراییەکی بەرچاوی بە خۆوە دیت، ئەگەرچی ئەم دوو وڵاتە "بە نهێنی" تاکو سەرەتای ١٩٩٠ -کان لە گفتوگۆدا بوون. هەرچەند پرۆسەی ئاشتی زۆرجار لە بارێکی لەرزۆکدا بووە بەڵام سەرەڕای هەموو تشتێك ماوەتەوە و ئومێدی بەرهەم هێنانی ئاشتییەکی کردەنی لێدەکرێت.



لە ڕێگەی ئاشتیدا زۆر کۆسپ هەیە کە دەبێت بهێنە تێپەڕین، یەك کۆسپی نادیاری ئەم کێشەیە بەندە بە سەرچاوەکانی ئاوی ناوچەکەوە. بۆ ئێمەی خەڵکی سوید کە لە بەشێکی دەوڵەمەندی ناوچەیەکی ئاوییدا دەژین پێویستمان بە دڵەڕاوکێ نییە بەوەی چەند ئاو بەکاردەهێنین. هەروەها ئاستەنگیشە لە ڕەوشێکی وەکو ئەوەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیادا هەیە تێبگەین کە بەردەوام لە ڕووبەڕووبوونەوەی کەم ئاویی دایە. ئەمڕۆ لەم ناوچەیەدا نزیکەی یەك لە سەدی تێکڕای سەرچاوە ئاوە سازگارەکانی جیهان هەیە لە کاتێکدا پێنج لە سەدی دانیشتوانی جیهان لەوێ دەژین.

ئاو پێویستییەکی ڕەهای ژیان و گەشەسەندنی کۆمەڵگایە، بۆیە مەترسی بەرپابوونی کێشەی رامیاری لە سەر سەرچاوە ئاوە سنووردارەکان پتر دەبێت. لە ئیسرائیل و ناوچەکانی فەلەستین و ئوردن، هەروەها تا ڕادەیەك لە بەشێکی سووریا، دەستڕاگەیشتن بەسەر ئاوی سازگاردا فرە کەمە. ئاڵۆزتر بوونی ڕەوشەکە لەوەدایە کە بەشێکی زۆری ئەم ئاوی سازگارە لە چەند زێییەکەوە دێن کە سنووری دەوڵەتییەکان دەبڕن. ئەو ئاستە نزمە لە هەبووی ئاوی سازگار، بە بەراورد لەگەڵ پتربوونی ژمارەی دانیشتوان، تەوژمێکی بەهێزتر دەخاتە سەر ئەو بڕە کەمە سەرچاوە ئاوییانەی کە هەیە، ئەمیش مانای زیاترکردنی مەترسی کێشەی ئاو دەگەیەنێت. دیسان

کەمی ئاو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کۆسپێکە لەبەردەم گەشەی ئابووری. هەروەها کەمی ئاو دەتوانێت کۆسپ بخاتە بەردەم گەشەی کشتوکاڵیشیەوە. چونکە کشتوکاڵ پێویستی بە ئاوێکی زۆر هەیە، زۆر لە وڵاتان ناچاردەبن خۆراك بهێنن لەبری ئەوەی خۆیان بەرهەمی بهێنن.

کێشەی ئاو و مەترسی ئاڵۆزبوونی لە گەلێك ناوچەی رووباراویی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیادا هەیە، بۆ نموونە رووباری نیل، هەروەها دیجلە و فورات، بەڵام ئەم نامیلکەیە زیاتر پەیوەستە بە ناوچەکانی دەوروبەری زێی ئوردن، لە دەمێکدا کە رۆڵی بابەتی ئاو لە پرۆسەی ئاشتیدا گرنگی تایبەت وەردەگرێت. جگە لەمە کاریگەری کەمی ئاو لە سەر پرۆسەی ئاشتی (لە نێوان ئیسرائیل- فەلەستین، ئیسرائیل- ئوردن، ئیسرائیل-سووریا) دێتە باسکردن. هەروەها جۆرەها کۆسپ و ئەگەر، کە لە رێگەی چارەسەرکردنی داهاتوانەی پرسی ئاوە، دەخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.



## ئاو و ئاسایش

ئەو بەها بەرزەی کە ئاو هەیەتی بۆ بژێوی مرۆڤ و گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگا وا دەکات کە ئاو گەلێك گرژبوونی سەختی رامیاری لێبکەوێتەوە. لە زۆربەی پرۆسەکانی کۆمەڵگا و سروشتدا، ئاو جێگیری نییە بۆیە دڵنیا بوون لە مسۆگەرکردنی ئاو زۆر گرنگتر دەبێت لەوەی کە ئەگەر ئاو ئەڵتەرناتیڤێکی جێگیری هەبوایە. پشتبەستن بە ئاوی سروشتی شتێکی بنەڕەتییە چونکە لابردنی شۆری ئاو یان گواستنەوەی ئاو بەهۆی کەناڵەوە ئەڵتەرناتیڤێکی بە ئەرکی درێژخایەن و گران بەهایە. لەو دەڤەرانەی کە کەم ئاون و وڵاتان ململانێیانە لە سەر بەدەستهێنانی ئەو کەمە سەرچاوە ئاوییانە، ئەوا دەستڕۆیشتن بەسەر ئەو سەرچاوە ئاوییانەوە وەکو پرسێکی ئاسایشی نەتەوەیی دهێتە مەزندەکردن.

لە راستیدا رووبار و زێ و چەم و سیستەمی ئاوی ژێر زەوی سنووری وڵاتان دەبڕێت و پێدەچێت رۆڵی بەرچاوی هەبێت لە دروستکردنی کێشە لە نێوان حکوومەتەکاندا.

پشتبەستنی چەند وڵاتێك بە سەرچاوەی چەند ئاوێك کە چاوگەکانی لە لایەن وڵاتانی ترەوە کۆنترۆڵ کرابن وا لە ئاو دەکات ببێتە ئامرازێکی کردەنی ئامادەباشی لە هەر کێشەیەکی رامیاریدا، چونکە وڵاتانی ناوچەی هەڵقوڵانی ئاوەکە دەتوانن لە زۆر رووەوە رۆچوونی ئاوەکە هەژموون بکەن لە ئەو وڵاتە/وڵاتانەی کە دەکەونە

ژێر ڕێڕەوی ئاوەکەوە. ئاو شتێکە کە نەتەوەکان گرێدەدات بەیەکەوە، بە پێچەوانەوە دەکرێت ئاو ببێتە هۆکاری گرژی سنووری رامیاری نێوان وڵاتەکان. ئاو کە خەسڵەتی بڕینی سنووری وڵاتانی هەیە- دەکرێت ببێتە هۆکاری هاوکاریکردن یان کێشە دروستکردن. بە شێوەیەکی نەرێتی و بە پلەی یەکەم ئاسایشی وڵاتان هەردەم بە رەوشی ستراتیژی-سەربازییەوە بەندکراوە. بەڵام ئەمڕۆ ئاکاری زۆرێك لە وڵاتان نیشانیان داوە کە ئاو، تاکو رادەیەك هەندێك سەرچاوەی تر، بوون بە بەشێکی گەنگەشەی ئاسایشی نەتەوەیی. ئەمە لە بەرئەوەی بەشەکانی تری ئاسایشی نەتەوەیی، وەکو ئاسایشی ئابووری و خۆراك، لەوانەیە بکەونە ژێر هەڕەشەی راستەقینەی کەم ئاوییەوە.

ئەمڕۆ زۆر کەس لەو بڕوایە دایە کە ئاو هۆکاری جۆرەها کێشەی نێوان وڵاتانە. هەروەها باوەڕیش دەکرێت لە دوارۆژدا ئاو ببێتە هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەی تریش. بە شێوەیەکی سەرەکی کێشەکانی ئاو زیاتر دەربارەی دابەشکردنی سەرچاوەکانی ئاوە لە نێوان وڵاتاندا یان پیسکردن و "خراپکردنی" ئەم سەرچاوە ئاوییانەن. لە گەلێك کێشەی ئاوییدا هەردوو فاکتەرەکە جێ و شوێنیان دیارە.

هەندێك توێژەوەر وا دەخەملێنن کە کێشەی ئاو لە دەڤەرە وشکەکاندا ئۆتۆماتیکییانە دەکرێت ببێتە مایەی کێشەی چەکداری



بەڵام تاکو ئێستا ئەم بۆچوونە پشتڕاست نەبۆتەوە. بە پێچەوانەوە دەبێت چەندین هۆکار لە بەرچاو بگیرێن بۆ ئەوەی ئەگەری مەترسییەکانی کێشەی گرێدراو بە ئاو بخەملێنرێت. جگە لە دابەشکردنی سەرچاوە ئاوییەکان دەبێت مرۆڤ رێز لە ئابووری و دامەزراوە جێگیرەکانی حکوومەتەکان، پتربوونی رێژەی دانیشتوان، پەیوەندییە رامیارییەکان، ئەگەری هەبوونی کێشەی نەرێتی لە نێو خەڵکانی دەوروبەری دەڤەری ئاوەکە، هەبوونی پەیمانێك بۆ پێوانەکردنی دابەشکردنی سەرچاوە ئاوییەکان لە ناوچەکە، هەروەها تای تەرازووی پەیوەندی نێوان هێزەکانی ناوچەکە بگرێت. توانای ئابووری و دامەزراوەیی وڵاتێك لە کێشەی ئاوییدا گرنگە چونکە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان، بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، دژوارتر خۆیان لەگەڵ رەوشی کەم ئاوییدا دەگونجێنن. لە وڵاتە تازە پیگەیشتووەکاندا کەرتی کشتوکاڵ بەکاربەرێکی گەورەی ئاوە (بڕوانە خشتەی ١) ئەمە جگە لەوەی کە خەڵکانێکی زۆر راستەخۆ و ناڕاستەوخۆ پشت بە کشتوکاڵ دەبەستن. ژ بەرهەندێ بواری کەمکردنەوە بۆ دەستکەوتنی ئاو زۆر کەمە.

**خشتەی ١. بەکاربردنی ئاو لە ناو جۆرەها کەرت (بە٪)**

| کیشوەر | کشتوکاڵ | کەرتی پیشەسازی و خزمەتگوزاری | پێویستی ماڵان |
|---|---|---|---|
| جیهان | ٦٩ | ٢٣ | ٨ |
| ئەفریقیا | ٨٨ | ٥ | ٧ |
| ئاسیا (بە رۆژهەڵاتی ناوڕاستەوە) | ٨٥ | ٩ | ٦ |
| ئەمریکای باشوور | ٥٩ | ٢٣ | ١٨ |
| ئەمریکای باکوور | ٣٩ | ٤٧ | ١٣ |
| ئەمریکای ناوەڕاست | ٨٦ | ٨ | ٦ |
| ئۆقیانووسەکان | ٣٤ | ٢ | ٦٤ |
| ئەورووپا | ٣١ | ٥٥ | ١٤ |

*سەرچاوە: World Resources Institute 1998-1999*

بە ئەم جۆرە چارەسەرکردنی کێشەی دابەشکردنی ئاو فرە ئاستەنگترە ئەگەر لایەنەکانی کێشەکە هەژار- یان ناپیشەسازی بن. لە لایەکی تر وڵاتانی پیشەسازی ئابوورییانە تەماشای ئەم گرفتانە دەکەن، تاکو هەڕەشەیەك بۆ سەر بوونیان، چونکە ئەمان دەتوانن



کەرەستەی خواردەمەنی بهێنن لە دەمێکدا ئەگەر بەرهەمهێنانی پێویستی بە ئاوێکی زۆر بکات. پتربوونی ژمارەی دانیشتوان فشارێکی تر دەخاتە سەر ئەم وڵاتانە لەبەرئەوەی پێویستی بۆ ئاو زیاتر دەبێت لە هەمان دەمدا پیسبوونیشی.

پەیوەندییە رامیارییەکانی ناوچە رووباراوییەکان فاکتەری گرنگن لە یەکلایی کردنەوەی مەترسی دروستبوونی کێشە. لەو ناوچانەی کە کێشەی مێژوویی ناچارەسەرکراوی لێ هەیە، دەکرێت زۆر بە ئاسانی سەرچاوەکانی ئاو ببێت بەهۆی قووڵتربوونی کێشەکان. بە پێچەوانەوە، لە بری قووڵترکردنی کێشەکان، دەکرێت ناکۆکی سەر سەرچاوە ئاوییەکان لە دەوروبەری ناوچەی سەرچاوە ئاوییەکان بهێنە چارەسەرکردن، ئەگەر کولتوورێکی هاوکاری لە مەڕ بابەتەکانی تر لە ئارادا هەبێت.

هەروەها تای تەرازووی هێزی لایەنەکانی دەوروبەری ناوچەیەکی رووباراوی یەکلاییکەرەوەن. گرنگترین پرسیار، کام لە وڵاتەکانی دەوروبەری ناوچە رووباراوییەکە لە رووی سەربازی و رامیارییەوە بەهێزترە. ئەو وڵاتەی کە لە پێگەیەکی بەهێزتردا خۆی دەبینێت توانای ستراتیژی باشتری لە سەپاندنی مەرجەکانی بەسەر دابەشکردنی ئەو ئاوە هاوبەشەدا هەیە. لە ناوچە رووباراوییەکانی دیجلە و فورات-دا پێگەی وڵاتی تورکیا باشە چونکە کانیاوەکانی هەردوو رووبارەکە دەکەوێتە ئەم وڵاتەوە لە هەمان دەمدا تورکیا لە

رووی سەربازییەوە بەهێزترە لە هەردوو وڵاتی سووریا و عیراق کە ڕێڕەوی ئاوەکەیان تێدادەڕژێت. ئەمە وا دەکات کە تورکەکان- کەم تا زۆر- مەرجەکانی خۆیان بەسەر دابەشکردنی ئاوەکەدا بسەپێنن.

هۆکارێکی بایەخدار و گرنگ کە لە گەنگەشەی کێشەی سەر ئاودا دەبێت ئاماژەی پێبکرێت، ئەوەیە کە زۆر لە وڵاتان، کە ئاساییانە گوتارێکی ناسیۆلیستانە و تەنانەت دوژمنکارانەیان دژ بە یەکتر هەیە، هەندێك جار لەبەر بەرژەوەندی دوولایەنیی هاریکاری یەکتر دەکەن. ئەم ڕەوشە دەچەسپێنرێت تەنانەت بەسەر دابەشکردنی ئەو ئاوەی کە هاوبەشە. هاوکاری پێشوەختی نێوان ئیسرائیل و ئوردن لەمەڕ پرسی ئاو نموونەیەکی باشە هەرچەندە ئاشتییەکی فەرمی لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا لە ئارادا نەبوو.

ڕێی تێدەچێت کە پتربوونی هۆشیاریی دەربارەی کەمی ئاو و ترس لە بەرپابوونی کێشەی سەربازی ببنە هۆی ئەوەی کە وڵاتان بگەڕێن بە دوای چارەسەری هەڤپشك بۆ گرفتی ئاو. نموونەی زۆر هەیە کە چۆن وڵاتان دەربارەی گرفتی ئاو هاوکاری یەکتریان کردووە، هەرچەندە ئەمان لە کێشەیەکی ڕاستەقینەی ڕامیاریشدا بوون. وەك هاوکاری کاری نێوان ئیسرائیل و ئوردن.

تەنانەت بۆ ئەوەی لە داهاتووشدا، لەو دەمەیدا کە کەم ئاویی خراپتر دەبێت، بتوانین چارەسەری هەڤپشکانە بۆ ئەم گرفتانەی کە باسکرا، بدۆزینەوە دەبێت دانوستانی هۆشیارانە لەناو ڕێکخراو و

دەزگا جیهانییەکاندا بکرێت، بۆ نموونە وەکو بانکی جیهانی. ئەرکی سەرەکی ئەم دەزگا و ڕێکخراوانە، دەبێت پێش هەموو تشتێك، رازیکردنی ئەو وڵاتانە بێت کە لە کێشەیەکی ئاوییدا تێوەگلاون، لەوەی کە بزانن هاوکاریکردن دەبێتە هۆی رەوشێکی باشتری ئاویی بۆ هەموو لایەنەکان لە بەرامبەر ناهاوکاریکردندا.

**بە کورتی** مرۆڤ لەو بڕوایە دایە کە کێشەی ئاو لەو دەڤەرە هەژارانە پەیدا دەبێت کە خەسڵەتی دابەشکردنێکی نادادپەروەرانەی سەرچاوەکانی ئاویی هەیە، ئەمە جگە لە رەوشێکی ناجێگیری رامیاریش. زیاتر لەو بڕوایە دایە کە کێشەی پەیوەندار بە ئاو نابێتە هۆی کێشەی چەکداری، بەڵکو دەبێتە هۆی رووبەڕووبوونەوی رامیاری. Aaron Wolf ئارۆن وڵف کە پرۆفیسۆری جوگرافییە، کە وەکو پسپۆڕێکی ئاویی بۆ ئەو گفتوگۆ بەردەوامەی کە لە نێوان ئیسرائیل و سووریا-دا هەیە بانگهێشتکراوە، دەبێژێت: "ئەگەر مێژوو تشتێکی فێرکردبین ئەوا ئەویش ئەوەیە کە ناکۆکی لەسەر زەقترین ناکۆکییەکانی ئاوییش دەکرێت بهێنە چارەسەرکردن — کە ئاساییانە چارەسەریش کران — بە شێوەیەکی ئاشتییانە."



## کەم ئاویی

پێوانەیەکی گشتی بۆ کەم ئاویی بریتییە لەوەی کە وڵاتێك کەمتر لە ١٠٠٠م$^3$ (مەتر سێجا) ئاوی تازەکراوەی بۆ هەر یەك کەس لە ساڵێکدا هەبێت. ئەگەر وڵاتێك کەمتر لە ١٧٠٠م$^3$ ئاوی تازەکراوەی بۆ هەر یەك کەس لە ساڵێکدا هەبێت ئەوا ئەو وڵاتە لە باری "نیگەرانی ئاویی" دایە. بۆ ئەوەی ئەم ژمارانە بخەینە ئاسۆی لێتێگەیشتنەوە دەکرێت ناوی سوید بهێنینەوە کە پتر لە ٢٠٠٠٠ م$^3$ ئاویی تازەکراوەی بۆ هەر یەك کەس لە ساڵێکدا هەیە. نزیکەی ٨٠ وڵات، کە لە ٤٠٪ دانیشتوانی گۆی زەوی پێکدەهێنن گیرۆدەی کەم ئاویی — یان هەیە. نزیکەی ١,٢ ملیارد مرۆڤ، لە پێشدا لە وڵاتانی جیهانی سێهەم، ئاوی پێویستیان بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی راگرتنی پاك و خاوێنیان نییە.

ئەمڕۆ کەم ئاویی زۆر لە وڵاتان ناچاردەکات کە ئاوی ناتازەکراوەی، یان زۆر کەم تازەکراوەی، سەرچاوەکانی ژێر زەوی بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەرچی زیاتری بەرزبوونەوەی داواکاریی ئاوە بەکاربهێنن. ئاوی ناتازەکراوەی سەرچاوەکانی ژێر زەوی ئەو جۆرە ئاوەیە کە ناکەوێتە چوارچێوەی خولی سوڕاندنی ئاوەوە. ئەم ئاوانە زیاتر قەتیس ماوەی قاژی و بۆشایی ژێر زەمین و بن شاخەکانن.

ئەمە پتر وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیان کە لەم جۆرە ئاوی ناتازەکراوە بەکاردەهێنن. لەم ناوچەیەدا ڕێژەی ئاوی تازەکراوە ١٥٧٧م$^{3}$ -یە بۆ هەر کەسێك لە ساڵێکدا، لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە بە گشتی لە ناوچەکانی تری جیهاندا بۆ هەر کەسێك لە ساڵێکدا نزیکەی ٧٠٠٠م$^{3}$ — ە. دژوارترین ڕەوشیش وڵاتەکانی دەوروبەری زێی ئوردن پێوەی دەناڵێنن (بڕوانە خشتەی ٢).

**خشتەی ٢: بەکارهێنانی ئاوی تازە و ڕێژەی کەڵك لێوەرگیرانی**

| وڵات | ئاو بەکارهێنان /کەس/ساڵ/م$^{3}$ | ڕێژەی کەڵك لێوەرگرتن (٪) بۆ سەرچاوەی ئاوی تازەکراوە* | پتربوونی دانیشتوان ١٩٩٥-٢٠٠٠ (٪) |
|---|---|---|---|
| ئیسرائیل | ٤٠٧ | ١٠٩ | ١,٩ |
| کەناری ڕۆژئاوا/غەزە** | ١٠٠ | ١٢٠ | ٣,٢ |
| ئوردن | ٢٠١ | ١٤٥ | ٣,٣ |
| سووریا | ١٠٦٩ | ٢٠٦ | ٢,٥ |
| لوبنان | ٤٤٤ | ٣٣ | ١,٨ |



** ڕێژەی کەڵك وەرگرتن دەکرێت لە ١٠٠٪ تێپەڕ بکات چونکە وڵاتەکان کەڵك لە ئاوی ناتازەکراوەی ژێر زەمین وەردەگرن، هەروەها لە ڕێگەی لابردنی شۆری ئاویشەوە.*

*** ژمارەکانی کەناری ڕۆژئاوا و غەزەی ساڵانی ١٩٩٠-١٩٩٥ ە.*

سەرچاوە: **World Resources Institute 1998-99 and Gleick Peter, 1993.**

ئیسرائیل و ناوچەکانی فەلەستین و ئوردن لە ڕەوشێکدا دەژین کە خەسڵەتی "کەم ئاویی" هەیە. بە بەراورد لەگەڵ ساڵەکانی ١٩٩٠ ئەمڕۆ ڕەوشەکە گەلێك خراپتر بووە. ئێستا ئیسرائیل ئاوی تازەکراوەی بۆ هەر کەسێك لە ساڵێکدا ٢٨٩م$^{3}$ ، ڕێژەی ناوچەکانی فەلەستین نزیکەی ١٠٠م$^{3}$ —ە و ئوردن ١٤٤م$^{3}$ -ە. دژوارترین ڕەوش مانگە وشکەکانی وەرزی هاوینە و بەهۆی ئەم وشکە ساڵانەی دواییشەوە کە ڕووی کردۆتە ناوچەکە ڕەوشەکە گەلێك سەختتر بووە. لە ڕوانگەیەکی دوارۆژیدا دەستکەوتنی ئاو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆر ناهەموارتر دەبێت.

ئیسرائیل و ناوچەکانی فەلەستین و ئوردن سەختترین ڕەوشیان هەیە. ئەمیش دەرئەنجامی گەلێك هۆکاری جیاوازە، لەوانە زۆربوونی ڕێژەی دانیشتوان و خراپبوونی چڵۆنایەتی ئاوەکە لە

ئەنجامی پیسبوونەوە. پێشبینییەکانی پێویستی ئاو بە گوێرەی ئاوی هەبوو بۆ تێکڕای ئەم ناوچەیە جێگای نیگەرانی زۆرە. ساڵی ٢٠٢٠ ئیسرائیل ٩٥٠ ملیۆن مەتر سێجا ئاوی کەمتر دەبێت، ئوردن ٩٠٠ ملیۆن مەتر سێجا ئاو، بەڵام بۆ کەناری رۆژئاوا وا دەخەمڵێنرێت کە پێویستی ئاو بە گوێرەی ئاوی هەبوو تاکو رادەیەك وەکو ئەمڕۆ بێت (تەنانەت وا پێشبینی دەکرێت کە زێدەهەبوونێك بە نزیکەی ١٢٠ ملیۆن مەتر سێجا ئاو لە ساڵێك هەبێت). ئەم ژمارانە، کە راستی و دروستی جێگای مشت و مڕە، لەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئیسرائیل، تاکو هەردوو ناوچەکانی فەلەستین و ئوردن، پێویستی بۆ ئاو زیاتر دەبێت. ئەمە پشت دەبەستێت بەوەی کە مرۆڤ وا دەخەملێنێت کە ئیسرائیل پێویستی بە ئاوی زیاتر دەبێت چونکە ئاستی ژیانی دانیشتوانەکەی بەرزترە، دامەزراوەی پیشەسازی زیاترە، دابەشکردنی سەرچاوەی ئاو چۆنە ئەمڕۆ هتد.



## زێی ئوردن

ئەگەر هەموو ئەو وڵاتانەی کە پشت بە ئاوی زێی ئوردن دەبەستن لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی سەرچاوە ئاوییەکانی ناوچەی زێیەکە رێکنەکەون ئەوا هاتنەدی ئاشتییەکی بەکار و جێگیر ئاستەنگ دەبێت. لەم ناوچەیەدا گەلێك بەرژەوەندی هەیە کە دژ بە یەکترن. ئاوی زێی ئوردن دەکەوێتە ژێر دەسترەسی چوار وڵات — ئیسرائیل، ئوردن، سووریا و لوبنان — هەروەها بەڕێوبەرایەتی فەلەستینیش. داواکاری لەسەر سەرچاوەکانی ئاوەکە بووە بە بەشێك — بەردەوامیش دەبێت — لە ئایدۆلۆژی و روانگەی ئاسایشی نەتەوەیی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ ئەوانەی کە ئاوی ئەم زێیە بەکاردەهێنن. بە گشتی بەبێ بوونی سەرچاوەی ئەم ئاوە کەمە بوونی چالاکی مرۆڤی لەم دەڤەرە، کە زیاتر لە بیابان پێکدێت، ناشیاو دەبوو.

## جوگرافیای زێی ئوردن

سەرچاوەکانی هەڵقوڵانی ئاوی زێی ئوردن لە ناوچە شاخاوییەکانی لوبنان دایە لە سەر سنووری سێ وڵات – سووریا و ئوردن و ئیسرائیل – دواتر بەردەوام دەبێت بە درێژایی ٣٥٠ کم بەرەو باشوور تاکو دەریای مردوو. سیستەمی ئەم زێیە ئاوی رووبەرێکی ١٧٣٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشە دەدات. تێکڕای خوڕی ئاوی زێیەکە ١,٤ کم$^{3}$ بۆ ساڵێك، ئەمیش وا دەکات زێیەکە بچووکترین زێ بێت لە ناوچەکەدا. ئەم زێیە دەکرێت بەراورد بکرێت لەگەڵ زێی گەورە لە کوردستانی لکێندراو بە وڵاتی عیراق کە درێژییەکەی نزیکەی ٣٩٢ کم و تێکڕای خوڕی ساڵانەی ئاوەکەی لە نێوان ١,٢٥ تاکو ٢,١٨ کم$^{3}$ دەبێت[1]. بە بەراورد لەگەڵ رووباری نیل، کە خوڕی ساڵانەی ٧٤ کم$^{3}$، هەروەها رووباری فورات کە خوڕی ساڵانەی ٣٢ کم$^{3}$، دەردەکەوێت زێی ئوردن چەند بچووکە.

سەرچاوەکانی هەڵقوڵانی بەشی باکووری زێی ئوردن لە سێ کانیاوی سەرەکییەوە دروستدەبێت. یەکێك لەمانە، زێی حەسبانی-یە، کە شوێنی هەڵقوڵانی دەکەوێتە وڵاتی سووریا-وە، بەڵام دوانەکەی تر،

---

١- عەبدوڵلا غەفور (١٩٩٦). *جوگرافیای کوردستان*. پەخش ئاپێك، ستۆکهۆڵم. ل. ٨٩. بە پێی ئەم سەرچاوەیە تێکڕای ئاوڕۆیشتنی زێی گەورە لە نێوان ٤٠-٧٠ مەتری سێگۆشەیە لە چرکەیەکدا.






نەخشەی (١)

زێی ئوردن و دەوروبەری

زێیەکانی دان و بانیاس، شوێنی هەڵقوڵانیان دەکەوێتە بەرزاییەکانی جۆلان کە داگیرکراوە و لکێندراوە بە ئیسرائیلەوە. بەشی سەرەوەی ئەم زێیە بەرەو خوار دێت و دواتر دەڕژێتە ناو دەریاچەی تەبەریە-وە (Sea of Galilee یان lake Tiberias) و لەوێشەوە بۆ دەریای مردوو.

یەکسەر دوای دەریاچەی تەبەریە، زێی یەرموك دەڕژێتە ناو زێی ئوردنەوە. شوێنی کانیاوەکانی هەڵقوڵانی زێی یەرموك لە سووریا-دایە و بە گەورەترین سەرچاوەی ئاوی زێی ئوردن دادەنرێت. بە پێی هەندێك هایدرۆلۆژیست تەنها سێ لە سەدی ٣٪ تێکڕای ڕێڕەوی ئاوی زێی ئوردن بە ناو خاکی ئیسرائیل-دا پێش شەڕی شەش ڕۆژەی ساڵی ١٩٦٧ تێدەپەڕی، لە کاتێکدا نزیکەی ٦٠٪ پێویستی ئاوی ئیسرائیل لە ناوچەکانی ڕێڕەوی ئەم زێیەوە دێتە دابینکردن. ڕێژەی ئاوی بەکارهاتوو لە کەناری ڕۆژئاوا دەکەوێتە نێو ژمارەکانی ئاماری ئیسرائیلەوە.

زێی ئوردن بۆ وڵاتی ئوردن گەلێك گرنگترە چونکە ئەم وڵاتە ٧٥٪ سەرچاوەکانی ئاویی لە ناوچەکانی ڕێڕەوی ئەم زێیەوە دابیندەکات. زێی ئوردن بۆ سووریا و لوبنان فرە گرنگ نییە چونکە سەرچاوەی سەرەکی ئاوی ئەم دوو وڵاتە لە جێگەی ترەوە دێت، لوبنان لە زێیەکانی لیتانی و عولیفییەوەیە و سووریا لە زێیەکانی فورات و عاسیەوە (Orontes river). ئێستا زیادەیەکی زۆر کەم



لە ئاو لە ناوچەکانی ڕێڕەوی زێی ئوردندا هەیە، بە تایبەتی بۆ ئوردن و ئیسرائیل، ئەمەش مانای وایە کە تەنها بڕێکی هێجگار کەم لە ئاوی تر دەتوانرێت بهێنرێتە دەرهێنان. بەدەر لەمە ئیسرائیل و ئوردن زیاتر کەڵك لەو ئاوە تازەبووەوە وەردەگرن کە دەکرێت ساڵانە تازە بێتەوە، ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە خوڕی ئاوی زێی ئوردن بەرەو کەمی دەچێت. "دەرهێنانی زیاتری" ئاوی ژێر زەوی دیاردەیەکی ئاشکرایە، بە تایبەتی لە کاتی وشکە ساڵییدا.

دەرهێنانی زیاتری ئاوی ژێر زەوی لەوانەیە ئاکامی خراپی لێبکەوێتەوە چونکە لە هەندێك دۆخدا بوار بە نزم بوونی چڵۆنایەتی ئاوەکە دەدات، چونکە ئاوی شۆر تێکەڵ بە سیستەمی ئاوی شیرین دەبێت. بۆیە دەکرێت هەر ئاو دەرهێنانێك هەستیار بێت، ئەگەر وڵاتێك ئاوی زیاتر دەربهێنێت ئەوا بە ئاشکرا مەترسی لە خراپکردنی چڵۆنایەتی ئاوەکە، بۆ سەر ئەو وڵاتانەی تر کە پشت بە هەمان سەرچاوەی ئاویی دەبەستن، دادەنێت. بابەتێکی تری هەستیار ئەو هەموو کەناڵ و بەنداو-انەن کە بە درێژایی ئەم ساڵانە بونیادنراون. بە هۆی ئەم هۆکارانەوە بڕی ئاوی زێیەکە گۆڕاوە، بەڵکو تەنانەت تەواوی سیستەمی زێیەکە گۆڕاوە وەکو دەرئەنجامێك لە کەمبوونی بڕی ئاو لە زێیەکە.

## کێشەی مێژوویی سەر ئاوی زێی ئوردن

لە سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە، لە ساڵی ١٩٤٨، زۆر پلان پێشکەشکراوە کە چۆن مرۆڤ بە باشترین شێوە کەڵك لەو سەرچاوە کەمە ئاوانە وەربگرێت، کە لە ناوچەکەدا هەن. هیچ لەم پلانانە بە ڕێککەوتن-نامەیەك، کە پەسەندی هەموو لایەك بێت، کۆتایی نەهات.

ساڵی ١٩٥١ زۆرێك لە وڵاتان پلانی گۆڕینی ڕێڕەوی ئاوەکەیان دارِشت. کاتێك ئوردن بە فەرمی پلانەکانی لە بۆ لادانی ئاوی زێی یەرموك بۆ کەناڵی ڕۆژهەڵاتی غۆر ئاشکراکرد، ئیسرائیل دەستیکرد بە لادانی ئاوی گۆماوی هوَلیَ کە تاکو رادەیەك کەوتبووە ناوچەی چەك داماڵدراوی نێوان سووریا و ئیسرائیل-ەوە. ئەم کارەی ئیسرائیل بوو بە هۆکاری چەندین پێکدادانی سەربازی بە قەبارە بچووك لە نێوان هەردوو وڵاتدا. ساڵی ١٩٥٣ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕێگەی نوێنەرێکییەوە بە ناوی ئێریك جۆنستۆن Eric Johnston هەوڵی گەیاندنی چارەسەرکردنێکی بەرفراوانی بۆ کێشەی ئاوی زێی ئوردن دانا. ئەم پلانە (زیاتر بە پلانی جۆنستۆن ناودەبرێت) پێشکەشکراوە چارەسەری کۆنکرێتانەی لەخۆگرتبوو ئەویش بە پێشنیاری بونیادنانی چەندین کەناڵ و بەنداو، ئەمە جگە لە نەخشەی پێشنیارکراو لە چۆنیەتی دابەشکردنی سامانە ئاوییەکان. ئەم پلانە لە لایەن کۆنسوڵی کۆمکاری عەرەبی-یەوە



*The Arab League Council* ڕەتکرایەوە. کۆمکاری عەرەبی، لە ساڵی ١٩٤٥ لە لایەن وڵاتە عەرەبییەکان بە مەبەستی بەدیهێنانی یەك دەنگی عەرەبی خولقێنراوە، پێیوابوو پلانەکە هەوڵێکی تری زایۆنیستی و ئیمپریالیستییە بۆ فراوانکردن و پاوانکردنی سامانی گەلێك گرنگ لە سەر بەرژەوەندی نەتەوەی عەرەب. هەرچەندە لایەنەکان لە سەر پلانەکە ڕێکنەکەوتن بەڵام دواتر ئەمە بوو بە بەردی بناغە بۆ کۆبوونەوە و ئاخاوتنەکانی سەرچاوە ئاوییە هاوبەشەکانی ئەم دەڤەرە.

هەوڵەکانی ئەمریکا بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك بوو بە هۆی ئەوەی کە تەنانەت نوێنەرەکانی ئیسرائیل و ئوردن تا رادەیەك بە شێوەیەکی دارِێژراو کۆببنەوە، وەك دبێژن " Picnic Table Talks"، بۆ گفتوگۆکردن لە سەر خوڕی ئاوی زێی یەرموك و دابەشکردنیشی. ئەمەش یارمەتی هێورکردنەوەی تەنگەژە و کێشە دروستکردنی لە نێوان هەردوو وڵاتدا.

ساڵی ١٩٥٣ ئیسرائیل دەستیکرد بە بونیادنانی *National Water Carrier*، ئەمیش هێڵێکی ئاوییە کە ئاو لە بەشی باکووری وڵاتەوە — ئاو لە دەریاچەی تەبەری-یەوە دەردەهێنرێت — بۆ بەشەکانی ناوەڕاست و بیابانی نەقەب لە باشووری وڵات دەگوێزێتەوە. بونیادنانی ئەم هێڵە ئاوییە بووە هۆی دروستبوونی گرژییەکی توند لە نێوان ئیسرائیل و وڵاتە عەرەبەکانی دراوسێیدا.

دوای چەند پێکدادانێکی سەربازی لەگەڵ سووریادا، هەروەها دوای نیشاندانی نارەزایی توند لە لایەن ڕێکخراوە نێو نەتەوەییەکانەوە، ئیسرائیل ناچار بوو پلانی بنچینەیی شوێنی دەرهێنانی ئاوەکە بگۆڕێت، ئەمیش بوو بە هۆکاری خەرجییەکی زۆر بۆ ئیسرائیلییەکان. National Water Carrier بۆ عەرەبەکان بوو بە هێمای فراوانخوازی و دوژمنکارانەی ئیسرائیل. یەکەمین کردەوەی سەربازی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی *PLO* Palestine Liberation Organisation کە پێشتر بە ئەل-فەتح دەناسرا ئاراستەی ئەم پڕۆژەیە کرا.

کێشەی ئاو یەکێك بوو لە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی شەڕی شەش ڕۆژەی نێوان ئیسرائیل و وڵاتە عەرەبییەکانی دراوسێی لە ساڵی ١٩٦٧. لە یەکەمین کۆبوونەوەی باڵای عەرەبی *first Arab Summit* لە ساڵی ١٩٦٤، کاتێك ئیسرائیل دەستی کرد بە لادانی ئاوی ناوچەی زێی ئوردن بۆ National Water Carrier، وڵاتە عەرەبییەکان ڕێککەوتن لەسەرئەوەی کە ڕێڕەوی سەرەکی ئاوی زێی ئوردن لابدرێت بۆ دەڤەرێکی عەرەبی. لە ساڵی ١٩٦٥ دا عەرەبەکان هەڵسان بە دامەزراندنی چەند بەنداوێك بۆ لادانی ئاوەکە، کە ئەمیش دەبووە هۆی کەمکردنی ئاو بە ڕێژەی ٣٥٪ بۆ پڕۆژەی ئاوی National Water Carrier ئیسرائیل. لە وەڵامدا



ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٦٥ دا ئەم بەنداوانەی، کە لە سەرەتای دامەزراندنیاندا بوون، چوار جار بۆمببارانکرد.

ئارێل شارۆن کە دواتر بوو بە وەزیری بەرگری (واتە دوای ئەم ڕووداوانەی کە باسکران)، لە سەرەتای ٢٠٠٠ کاندا بوو بە سەرۆك وەزیران، دبێژێت: "خەڵك بە گشتی وا دەزانێت کە شەڕی شەش ڕۆژە لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٦٧ دەستی پێکردووە، بەڵام لە ڕاستیدا شەڕەکە پێش دوو ساڵ و نیو دەستی پێکرد کاتێك ئیسرائیل بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر ئەو لادانانەی کە لەسەر ئاوی زێی ئوردن دانراوە."

لە ماوەی شەڕی حوزەیرانی ١٩٦٧ دا ئیسرائیل بە تەواوی ئەو بەنداوە عەرەبییانەی کە بە مەبەستی لادانی ئاوی زێی یەرموك دانرابوو خاپوور کرد، هەروەها لە ماوەی شەش ڕۆژدا سینا-ی لە میسر، کەناری ڕۆژئاوا لە ئوردن و بەرزاییەکانی جۆلان لە سووریا سەند. لە تەنیشت ئەم ناوچانە کە ئیسرائیل دەسەڵاتی خۆی بە سەردا سەپاند — کە بە هۆیەوە پێگەی ستراتیژی سەربازی پتەوتر کرد — ئیسرائیل پێگەی "ستراتیژی ئاوی" یشی زۆر باشترکرد، چونکە ئێستا ئەو کۆنترۆڵی دوو لەو سێ زێیانە دەکات کە ئاوەکەیان دەڕژێنە نێو بەشی باکووری زێی ئوردنەوە ئەمە جگە لە بەشێکی زێی یەرموك-یش. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە باری کردەنیدا سووریا و ئوردن چیتر ناتوانن بەردەوام بن لە لادانی ئەو

ئاوەی کە لە ساڵی **١٩٦٥** —وە دەستیان پێکردبوو. جگە لە کۆنترۆلکردنی بە شێوەیەکی گشتی هەموو زێی ئوردن، ئیسرائیل کۆنترۆڵی ئەو سێ زێ-یە ژێر زەوییەی کەناری رۆژئاواشی کرد کە دوانیان بەهایەکی پڕ بایەخیان لە پڕکردنەوەی پێویستییەکانی ئاوی ئیسرائیل هەیە.

لە ساڵی **١٩٦٩** گرژی تر روویدا، کاتێك ئیسرائیل گومانی لە ئوردن کرد، کە لە رێگەی کەناڵی غۆر-ی رۆژهەلاتیەوە کە تازە دایمەزراند بوو، ئاوی زیاتر لە زێی یەرموك دەردەهێنێت. گومانکردنەکان بوو بە هۆی ئەوەی ئیسرائیل دوو جار ئەم کەناڵە نوێیە بۆمبباران بکات. دەکرێت بگوترێت ئەم بۆمبابارانکردنە تەنها دەرئەنجامێکی گومانکردنەکانی ئیسرائیل نەبوو لەوەی کە ئوردن ئاوی زیاتر لادەبات. بەدەر لەمەش، لەوانە بێ ئەمە پەیوەندی بەو بۆچوونانەی ئیسرائیلەوە هەبێت کە ئوردن تا رادەیەك لێپرساوە لەو هێرشانەی کە فەلەستینییەکان لە ناو خاکی ئیسرائیلدا دەیکەن، چونکە ئوردن بووبوو بە دالدەی ئەوانەی کە هێرشەکانیان بە ئەنجام دەگەیاند.

دانوستانی نهێنی ساڵەکانی **١٩٦٩** و **١٩٧٠**، بە نێوبژیوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، رێککەوتنی لێبەرهەم هات. ئیسرائیل باوەڕی پێهێنرا کە خوڕی ئاوی زێی ئوردن سروشتییە و رازی بوو بەوەی ئوردن دەستبکاتەوە بە دروستکردنەوەی



کەناڵەکەی. لە بەرامبەردا ئوردن رازی بوو بۆ ئەو دابەشکردنی ئاوەی کە لە پلانەکەی جۆنستۆندا هاتبوو، هەروەها بەڵێنیدا کە چالاکییەکانی PLO لە ناو خاکەکەیدا رابگرێت، کە ئەمیش کرا.

هەن ئەوانەی کە دەڵێن مەبەستی ئیسرائیل لە داگیرکردنی باشووری لوبنان **١٩٨٢** ئاو بووە. ئەم بۆچوونە جێگای متمانەی تەواو نییە، بە تایبەتی لەبەر رۆشنایی گۆڕانکارییەکانی ئەمڕۆدا، کە سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل یەهود باراك، پێدەچێت ئامادە بێت لە جێهێشتنی باشووری لوبنان[2]. داواکاری یەهود باراك لە بەرامبەر جێهێشتنی باشووری لوبنان هیچ پەیوەندی بە پرسی ئاو-ەوە نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەندکراوە بە بەدەستهێنانی جۆرێك لە گەرانتی کردنی ئاسایش بەوەی کە حیزب الله لە هێرشکردنە سەر باکووری ئیسرائیل بەردەوام نەبێت، هەروەها ئەندامەکانی سوپای باشووری لوبنان South Lebanese Army SLA، کە هاوپەیمانی ئیسرائیلن لە باشووری لوبنان، وازیان لێبهێنرێت بە ئاشتی بژین.

### پرسی ئاو لە پرۆسەی ئاشتی-دا

پاش هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت و شەڕی کەنداوی **١٩٩٠-١٩٩١** رێسایەکی رامیاری نوێ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیدا بوو. زۆرێك لە وڵاتە عەرەبییەکان ناچار بوون بۆچوونەکانیان بەرامبەر

---

٢- ساڵی ٢٠٠٠ یەهود باراك سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل بوو.

ئیسرائیل هەڵسەنگێننەوە کە ئەمیش بە گشتی بوو بە هۆی بۆچوونێکی کراوەتر لە ناوچەکەدا. ئیسرائیل دوا نەکەوت لە قۆستنەوەی ئەم هەلە و شکاندنی گۆشەگیری، زۆریش تێکۆشا بۆ بە دەستهێنانی ڕێککەوتنی دوو قۆڵی لەگەڵ جۆرەها وڵاتی عەرەبی.

## دانوستانی فرە لایەنە

هەر لەو دەمەی کە دانوستانی فرەلایەنە (کۆبوونەوە و گفتوگۆی نێوان چەند لایەنێك) لە مەدرید ساڵی ١٩٩١ دەستپێکرد پرسی ژینگە، کۆنترۆڵکردنی خۆپڕچەککردن، پرسی ئاوارەکان، هاوکاری و گەشەکردنی ناوچەیی، هەروەها پرسی سەرچاوەکانی ئاویی گفتوگۆی لەسەر کرا. لە دەمی بینیامین ناتانیاهۆ-دا، کاتێك سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل بوو، ئەم دانوستانانە سارد و سڕ بوون چونکە وڵاتە عەرەبییەکان ناڕەزامەند بوون بەرامبەر ئەو ڕامیارییەی کە ناتانیاهۆ بەڕێوەی دەبرد. زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان بەشداربوون لەم دانوستانانەدا، بەڵام بێجگە لە سووریا و لوبنان.

کە لوبنان و سووریا خوازیارنەبوون بەشدار بن لە دانوستانەکاندا — لەوانەیە لوبنان ئارەزوومەندی بەشداریکردن بایە بەڵام لە پراکتیکدا سووریا لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتی لوبنانییەکان لەم پرسانەدا خاوەن بڕیارە — ئەگەرەکانی گەیشتن بە چارەسەرێکی گشتی بۆ کێشەی ناوچەکانی ڕێژەوی زێی ئوردن زۆر کەمترکرد.



لەم دانوستانەدا ئیسرائیل خوازیاربوو ڕوانگەی تەکنیکی و ڕامیاری پرسی ئاو لە یەکتر جیابکاتەوە. ئەوان پێیان وابوو گرووپە فرە لاکان دەبێت پێش هەموو تشتێك، بە مەبەستی پترکردنی بڕی گشتی ئاوی ناوچەکە، هەروەها بە مەبەستی بەدیهێنانی سوود وەرگرتنێکی باشتر لە ئاوەکە، خۆیان ئاراستەی پرسە تەکنیکییەکان بکەن. لە لایەکی تر، لە لای ئیسرائیلییەکان مافی ئاو وەکو پرسێکی ڕامیاری سەرەکی دەبینرا، کە پێویست بە گفتوگۆی دوو لایەنە دەکات. لە بەرامبەردا وڵاتە عەرەبییەکان پێیان وابوو، پێش هاوکاری تەکنیکی بە مەبەستی باشترکردنی بەکارهێنانی ئاوی ناوچەکە، پێویستە گفتوگۆ لە سەر مافی ئاو بکرێت.

تێڕوانینی جیاوازی ئیسرائیل و وڵاتە عەرەبییەکان بوو بە ڕێگرێکی گەورە لە بەردەم هەر پێشکەوتنێکی مانادار. سەرەڕای ئەم گرفتە باسکراوانە جۆرە پێشکەوتنێك بەدیهاتووە، وەکو ڕێککەوتن لە سەر دروستکردنی "بانکی زانیاری" هاوبەش کە لەوێدا زانیاری لە سەر هایدرۆلۆژی، سەرچاوە ئاوییەکان و هتد. کۆبکرێتەوە. لەمەش زیاتر سەنتەرێکی "لابردنی شۆریی ئاو" لە عومان دامەزرێنرا کە لەوێدا تەکنیکی لابردنی شۆریی ئاو پرۆڤەدەکرێت و کۆرسی خوێندن فەراهەم دەکرێت.

## دانوستانەکانی نێوان ئیسرائیل و فەڵەستین

بەکارهێنانی ئاو لە ئیسرائیل بە ڕێژەی یەك کەس لە ساڵێکدا گەلێك زۆرترە بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئاوەی کە کەسێك لە ساڵێکدا لە کەناری ڕۆژئاوا و غەزە بەکاریدەهێنێت (بەدەر لە جوولەکە نیشتەجێکان). هەندێك دەڵێن کە بڕێکی زۆری، وەکو ٨٢٪، ئاوی کەناری ڕۆژئاوا بۆ ئیسرائیل یان جوولەکە نیشتەجێکان دەچێت بەڵام تەنها ١٨٪ ئاوەکە بۆ ئەو فەڵەستینییانە دەچێت کە لە کەناری ڕۆژئاوادا دەژین. ساڵی ١٩٨١ ئیسرائیل چاوگەکانی ئاوی ژێرزەمینی کەناری ڕۆژئاوای کردە بەشێکی سامانی دەوڵەتی ئیسرائیل و لەو کاتەوە لەلایەن *میکەروت*-ەوە *Mekorot*، کە کۆمپانیای ئاویی وڵاتی ئیسرائیلە، کاری پێدەکرێت.

بە خۆماڵیکردنی سەرچاوەکانی ئاوی کەناری ڕۆژئاوا لە لایەن ئیسرائیلەوە، ڕەوشی گرژبووی نێوان ئیسرائیلییەکان و فەڵەستینییەکان پتر بوو. بەکارهێنانی ئاو لە لایەن فەڵەستینییەکانەوە بە توندی لە لایەن ئیسرائیلەوە پێوانەدار کراوە و لە هەمان دەمدا فەڵەستینییەکان ڕوخسەتی هەڵکەندنی بیر-یان زۆر بە دژواری دەستدەکەوێت. هەرچەندە ژمارەی دانیشتوانی فەڵەستین لە کەناری ڕۆژئاوا لە ساڵی ١٩٦٧ وە دوو قات زیاتر بووە بەڵام بڕی ئاوی بەرکەوتوو بۆ کەرتی کشتوکاڵ هەر وەکو ساڵی ١٩٦٧ەوە. ئاوی دەستکەوتوو بۆ پێویستی ماڵان تەنها لە ٢٠٪



زیاتری کردووە. ئەمە بووە بە هۆکاری هەڵکەندنی گەلێك بیری نایاسایی کە بە هۆیەوە چڵۆنایەتی ئاوی خراپکردووە چونکە ئەم بیرانە هەمیشە بە شێوەیەکی دروست هەڵنەکەندراون.

زەقتربوونی نایەکسانی/نادادپەروەری لە دابەشکردنی ئاودا لەو ڕاستییەدا خۆی دەبینێت کە میکەرۆت، لە هەمان کاتدا کە ڕێگە بە فەڵەستینییەکان نادات بۆ هەڵکەندنی بیر، ڕێگە بە جوولەکە نیشتەجێکان دەدات بۆ هەڵکەندنی بیری تازە. جگە لە ئەوە جوولەکە نیشتەجێکان ئاوێکی زۆر بەکاردەهێنن کە تاکو ڕادەیەك بەشێکی زۆری ئەم ئاوە بۆ ئاودانی هونەری گوڵزاری و باخەوانی بەکاردەهێنرێت (بنواڕە نەخشەی ٣).

ڕەوشی کەرتی غەزە گەلێك خراپترە چونکە جگە لە کەم ئاوییەکی ناهەموار ئەوا چڵۆنایەتی ئەو ئاوە کەمەش، لە ئەنجامی شۆربوون و بڵاوبوونەوەی ماددەی کیمیایی و پەیینەوە، زۆر خراپ بووە. گەلێك فەڵەستینی دبێژن کە کردەوەکانی ئیسرائیل لە پێوانەدارکردنی بەکارهێنانی ئاوی فەڵەستینییەکان لە کەناری ڕۆژئاوا و کەرتی غەزە دژ بە مافەکانی نێونەتەوەییە. بەڵام ئەم بۆچوونە ناکرێت ساغبکرێتەوە لەبەرئەوەی یاساکانی ئاوی نێودەوڵەتی زۆر نارۆشن داڕێژراوە.

سیاسەتی ئاوی ئیسرائیل لە غەزە و کەناری ڕۆژئاوا، بە بەراورد لەگەڵ نیشتەجێکان، کاریگەرییەکی زۆری خستۆتە سەر کۆمەڵگا و

ئابووری فەلەستین. بە بڕوای هەندێك ئامانجی ئیسرائیل لە پێوانەداری و گەلێك کردەوەی تر گرێدانی ئابووری فەلەستینە بە ئیسرائیلەوە، یان ڕێگەگرتنە لە —یان بە لایەنی کەمەوە دژوارکردنی- دامەزراندنی ئابوورییەکی سەربەخۆی فەلەستینی.

**نەخشەی ٣: ئاوی بەکارهاتووی ساڵانە بە ڕێژەی کەسێك/ساڵێك لە ئیسرائیل، کەناری ڕۆژئاوا و غەزە**

| | بەکارهێنانی ئاو بە مەتر چوارگۆشە بۆ کەس/ساڵ |
|---|---|
| ئیسرائیلییەکان (جگە لە نیشتەجێکان) | ٤٠٧ |
| فەلەستینییەکان | ١٠٠ |
| جوولەکە نیشتەجێکان (کەناری ڕۆژئاوا) | ٦٥٠ |
| فەلەستینییەکانی کەناری ڕۆژئاوا | ١٠٠ |
| جوولەکە نیشتەجێکان (غەزە) | ١٧٠٠* |
| فەلەستینییەکانی غەزە | >١٠٠ |

* بەشی زۆری ئەم ئاوە لە غەزەوە نایەت، بەڵکو لە سیستەمی ئاوی نەتەوەیی ئیسرائیلەوە دێت. ئێستا جوولەکە نیشتەجێکان لە کەرتی غەزە نەماون و ڕاگوێزران بۆ ناو خاکی ئیسرائیل (وەرگێڕ).

سەرچاوە: *Isaac, Jad, 1995*



## بنەماکانی ڕێککەوتن

ئاو یەکێکە لەو بابەتانەی کە دەکەوێتە ناو ئەو "بەرنامەی کار"ەی کە ئیسرائیل و PLO لە ساڵی ١٩٩٣ لە سەری پێکهاتوون و کە زیاتر بە "بنەماکانی ڕێککەوتن" ناوزەد دەکرێت. ئەم ڕێککەوتننامەیە چوارچێوەیەکە بۆ ئەو گفتوگۆیانەی کە لە ساڵی ١٩٩٣ وە دەستیان پێکرد و واش خەملێنراو بوو کە ساڵی ١٩٩٩ کۆتاییان پێبێت. بابەتی ئاو یەکێك بوو لەو بابەتانەی کە خرابووە قۆناغەکانی کۆتایی گفتوگۆکانی نێوان ئیسرائیل و دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی فەلەستینییەوە.

لە نێو مامەڵەکردنەکانی بنەماکانی ڕێککەوتندا، وەکو دەستپێك پێشکەوتن لە پرسی ئاودا بەدیهات. لە پەیماننامەی کاتی کە لە تابا Taba ی میسر لە حوزەیرانی ١٩٩٥ ئەنجامدرا، کۆنترۆڵکردنی سەرچاوە ئاوییەکان و دابەشکردنی ئاو بۆ دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی فەلەستین گوازرایەوە. ئەمە مانای کۆنترۆڵی تەواو ناگەیەنێت، بەڵکو تەنها مانای دەستڕاگەیشتن بەسەر ئەو ئاوە دەگەیەنێت کە دەکەوێتە ناو ئەو ناوچانەی کە دراوەتە فەلەستینییەکان، کە زیاتر پێی دەگوترێت ناوچەی A. (کەناری ڕۆژئاوا کراوە بە سێ ناوچەوە: ناوچەی A لە ژێر دەسەڵاتی فەلەستینی دایە، ناوچەی B لە ژێر هەردوو دەسەڵاتی فەلەستینی و ئیسرائیلی دایە و ناوچەی C لە ژێر دەسەڵاتی ئیسرائیلی دایە). لە

پراکتیکدا کۆنترۆڵی فەلەستینییەکان بەسەر سەرچاوەکانی ئاودا کۆنترۆڵی تەواو ناگەیەنێت چونکە تاکو ئێستاش کۆمپانیای ئاوی دەوڵەتی ئیسرائیل بەرامبەر پێدانی ئاو لێپرسراوە.

لاوازییەکی تری فەلەستینییەکان لەوەدایە کە تاکو ئێستاش مافی یاسایی مڵکدارییەتییان بەسەر سەرچاوەکانی ئاودا نییە، هەرچەندە لە رێککەوتننامەی واژۆکراوی ئێستا ئەم مافە دەستنیشان کراوە، بەڵکو ئەوان تەنها مافی وەرگرتن، پێشخستن و پەرەپێدانیان هەیە. لەم رێککەوتننامە کاتییەدا، ئیسرائیل بۆ یەکەمین جار دان بە مافی ئاو بۆ فەلەستینییەکان دەنێت، هەروەها لە یارمەتیدانی فەلەستینییەکان بۆ دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤی تر لەبۆ سەرچاوە ئاوییەکان خۆی پەیوەست دەکات، کە زیاتر مەبەستیان لابردنی شۆریی ئاوە. هەروەها بە مەبەستی رێکخستنی پرسەکانی ئاو، لە نێوان دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی فەلەستین و ئیسرائیلدا، کۆمیتەیەکی هاوبەشی ئاو دامەزرێنرا.

ئەو مامڵەکردنانەی کە دەربارەی ئاو لە نێوان ئیسرائیل و دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی فەلەستینی بەڕێوەچوو، هەر وەکو مامەڵە فرە لایەنەکان، ئەوەی نیشاندا کە هەردوو لایەن خاڵی دەستپێکی جیاوازیان هەبوو. فەلەستینییەکان ئاراستەی گفتوگۆکانیان بۆ بەدەستهێنانی مافی ئاو بوو بەڵام ئاراستەی ئیسرائیلییەکان بۆ هاوکاریکردن لە دۆزینەوەی چارەسەری تەکنیکی بۆ پترکردنی بڕی



ئاو بوو. سائیب عورەیقات کە مامەڵەکەرێکی "مفاوچ" فەلەستینییە دبێژێت: "مامەڵەکردنەکان دەربارەی مافی ئاون، بەڵام دەربارەی کەڵك لێوەرگرتنی ئەم سەرچاوانە فەلەستینییەکان دەڕوانن داهاتوویەکی هاوکاری لەگەڵ ئیسرائیلییەکان هەرزوو ئیسرائیلییەکان دان بەم مافانەدا بهێنن." بۆیە دان پیاهێنانی ئیسرائیل بە مافی ئاو بۆ فەلەستینییەکان لە ساڵی ١٩٩٥ بە هەنگاوێکی مەزن مەزەندە دەکرێت.

هەرچەندە مافی ئاو بۆ فەلەستینییەکان لە لایەن ئیسرائیلەوە دانی پێداهێنرا بەڵام بەردەوامی مامەڵەکردنەکان بێ تەنگەژە نەبوو، ئەویش زیاتر بەهۆی هاتنی حکوومەتی زۆرینەی نوێی ***لیکود***ەوە کە لە ساڵی ١٩٩٦ تاکو ١٩٩٩ فەرمانڕەوایی ئیسرائیلی کرد. لیکود هەمان تێڕوانینی ***پارتی کاری*** پێشووی بۆ پەیوەندییەکانی نێوان ئیسرائیل و دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی فەلەستین نەبوو. لە لای پارتی کار رێگای چارەسەری کێشەکان هاوکارییە، بەڵام لای لیکود جیاکردنەوەیە. لیکود پێی وایە هاوکاری کەمتر مایەی کێشەی کەمترە. دوای دەسەڵات وەرگرتنی ***یەهود باراك***، سەرۆکی پێشووی پارتی کار، لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٩ دا هەلی زیاتر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئاو رەخساوە.

گرفتێکی تری مامڵەکردنەکان ئەو "زانیاری ئاو"ە دەستکەوتووەیە کە نزیکەی هەمووی لە لایەن حکوومەتی

ئیسرائیلەوە بڵاوکراوەتەوە. ئەمەش باوەڕێکی وای لای فەلەستینییەکان خوڵقاندووە کە ئەم زانیارییانە وا داڕێژراون کە لە کاتی مامەڵەکردنەکاندا لە خزمەتی ئیسرائیلدا بێت. هەڵبەتە ئەمە بە توندی لە لایەن ئیسرائیلەوە بەرپەرچ دەدرێتەوە. ئا ئەم گرفتە ئەوە نیشاندەدات کە پترکردنی ئاشکرایی و کراوەیی سەر زانیارییەکان بۆ هەردوو لایەن زۆر پێویستن.

### ڕێککەوتننامەی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و ئوردن ١٩٩٤

لە ٢٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٤ ڕێککەوتننامەیەکی ئاشتی لە نێوان ئیسرائیل و ئوردن، کە بە بەربڵاوی باس لە پرسەکانی ئاو دەکات، واژۆ کرا. لە خاڵی دووی بەندی شەشەمی ڕێککەوتننامەکەدا هەردوو لا جەخت لەوە دەکەن کە ئەوان "پێویستی دۆزینەوەی چارەسەرێکی کردەنییانە و دادپەروەرانە بۆ گرفتەکانی ئاو کە لە سەری ڕێکبکەون دەبینن، هەروەها وا دەڕوانن کە ئاو دەکرێت بکرێت بە بنچینەی پێشخستنی نێوانیان". دیسان لایەنەکان هێڵێك دەکێشن بۆ پێشخستنی کاری هاوبەش لە بواری سەرچاوەکانی ئاودا، کاری هاوبەش لە ڕێگرتنی پیسبوونی ئاو و هەروەها یارمەتی دانی یەکتر لە کاتی ڕوودانی کەم ئاوییدا.



تەنانەت لە ڕێککەوتننامەکەدا باسی پێوانەکردن هاتووە، بەوەی کە هەر یەك لە ئەم دوو وڵاتە چەند ئاو لە ئەو سەرچاوە هاوبەشە بەکاربهێنن. ئوردن مافی بەکارهێنانی ٣٠ ملیۆن مەتر چوارگۆشەی لە ساڵێکدا لە ئاوی زێی ئوردن هەیە، بە بەراورد لەگەڵ هیچ پێش ڕێککەوتننامەکە. جگە لە ئەوەش ئیسرائیل بەشێکی بەرچاوی ئاوی بەکارهێنراوی زێی یەرموك لە قازانجی ئوردن کەمدەکاتەوە. هەرچەندە ئوردن بڕێکی ئاوی زیاتری لە ئەم ڕێککەوتنەی لەگەڵ ئیسرائیلدا دەستدەکەوێت بەڵام ئەم بەشە ئاوە هێشتا زۆر لەوە کەمترە کە لە پلانەکەی جۆنستۆن-دا هاتبوو.

گرفتێکی تری ئەم ڕێککەوتننامەیە دوو لایەنیەتی، چونکە ئەمە فەلەستینییەکان پەراوێز دەخات، کە هەڵبەتە داواکارییان لەسەر زێی ئوردن هەیە، هەروەها سووریا کە هەر کردەوەیەکی لەسەر ئاوی زێی یەرموك کاردەکاتە سەر ئەو بڕە ئاوەی کە دەچێت بۆ ئیسرائیل و ئوردن.

خاڵێکی گەشی ئەم ڕێککەوتننامەیە خۆبەستنەوەی ئیسرائیل و ئوردنە بە هاریکاری یەکتری بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتی سەرچاوە ئاوییەکان. وەزیری ئاوی ئوردن لە ئاشکراکردنی پرۆگرامی وەبەرهێنان لە کەرتی ئاو بۆ ساڵی ١٩٩٧-٢٠٠١ وا دەڵێت "...هاوکاریکردنی ناوچەیی یەکێکە لە باشترین ئەڵتەرناتیڤەکانی کەمکردنەوەی گرفتی کەم ئاویی. هاوکاری ناوچەیی ناکرێت وەکو

یارییەك سەیربکرێت کە لایەك دەیباتەوە و لایەك دەیدۆڕێنێت چونکە دەکرێت بڕێکی زۆری سامانی ئاو لە روانگەی هاوکارییەوە پاشەکەوت بکرێت ...".

وەکو دەرئەنجامێکی ئەم رێککەوتننامە ئاشتییە گەلێك پڕۆژەی هاوبەش، کە هێشتا نەچۆتە بواری جێبەجێکردنەوە، هەیە. هەستیاری ئەم رێککەوتننامەیە لە ساڵی ١٩٩٩ دا دەرکەوت کاتێك ئیسرائیل، دوای ساڵێك لە وشکانی، رایگەیاند کە بۆ ماوەیەکی کاتی وا دەبینێت کە بڕە ئاوی بەشی وڵاتی ئوردن، بە پێی رێککەوتننامەی نێوانیان، کەم بکاتەوە. ئوردن ئەمەی رەتکردەوە، بە ئاماژەکردن بەوەی کە ئاستی ئاوی هەبوو بابەتێك نییە کە گفتوگۆی لەسەر بکرێت.

ئەمەش رووی سروشتی تەقینەوە ئاسای بابەتی ئاو نیشاندەدات کە لایەنەکان ناتوانن پابەندی بن، تەنانەت لە کاتی هەبوونی رێککەوتننامەیەکی واژۆکراویشدا.



**ئاو لە دانوستانەکانی نێوان ئیسرائیل و سوریادا**

کێشەی سەرەکی نێوان ئیسرائیل و سوریا بەرزاییەکانی جۆلان-ە کە ئیسرائیل لە شەڕی شەش رۆژەی ساڵی ١٩٦٧ دا داگیریکرد. ئیسرائیل بەهۆی بە دەستهێنانی بەرزاییەکانی جۆلانەوە، جگە لە باشتربوونی پێگەی ستراتیژی سەربازی، کۆنترۆڵی دوو لەو سێ زێیەی کرد کە دەڕژێنە ناو بەشی سەرووی زێی ئوردنەوە، هەروەها بەشێکی زێی یەرمۆك-یش. وەکو گوتمان، چاوپێکەوتنی نهێنی لە نێوان ئیسرائیل و سوریا بە بەردەوامی هەبووە بەڵام لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٩ دا ئەم پرۆسەیە خێراییەکی بەرچاوی بە خۆوە دیت. ئەمەش بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ویستی سەرۆك وەزیرانی نوێی ئیسرائیل، یەهود باراك، بۆ گەیشتن بە ئاشتی لەگەڵ سوریا، هاوتەریب لەگەڵ کێشانەوەی هێزەکانی ئیسرائیل لە باشووری لوبنان، هەروەها بە باوەڕهێنانی سەرۆکی سوریا، حافیز ئەسەد، بەوەی کە تەنها رێگەی ریالیزمانە بۆ گەڕاندنەوەی بەرزاییەکانی جۆلان رێگەی دانوستانە لەگەڵ ئیسرائیل.

مەبەستی سەرەکی سوریا لە ئەم دانوستانانە بەدەست هێنانەوەی تەواوی بەرزاییەکانی جۆلانە، بەڵام ئیسرائیل لە روانگەی ئاسایشەوە دەڕوانن، بە وشەیەکی تر سنوورە تازەکان بتوانرێت بەرگرییان لێبکرێت و توانای پاراستنی مافەکانی ئاوییان پارێزراو بێت. دیسان ئیسرائیل دەیەوێت سوریا گەرەنتی بدات

بەوەی کە ئیسرائیل ناکەوێتە بەر هێرشی موشەکی حیزب الله، ئەگەر هێزەکانی لە باشووری لوبنان بکشێنەوە. زۆر کەس لە ئەو بڕوایەدایە ئەگەر سووریا بخوازێت توانای کاریگەری بۆ وەستاندنی کردەوەکانی حیزب الله لە باشووری لوبناندا هەیە، بەڵام دەکرێت بگوترێت کە سووریا کارتی حیزب الله بۆ فشار خستنە سەر ئیسرائیل و بەدەستهێنانی داواکاری زیاتر لە دانوستانەکانی لەگەڵ ئیسرائیلدا بەکاردەهێنێت.

ویستی ئیسرائیل بۆ دەرچوون لە بەرزاییەکانی جۆلان لە ئەگەری رەوشێکی لەباردا شتێکی شاراوە نییە، بەڵام ئاڵۆزییەکە لە بەدیهێنانی ئاسایش و رەوشێکی ئاویی دروستە کە جێی رەزامەندی هەردوو لا بێت. هەردوو وڵاتی ئیسرائیل و سووریا وا دەبینن کە ئاو پرسێکی گرنگە. ئیسرائیل وا دەبینێت چونکە وڵاتەکەی ئاوێکی هێجگار کەمی هەیە. سووریاش وا دەبینێت، هەرچەندە دەستی رادەگات بەسەر بڕە ئاوێکی زۆرتر تاکو ئیسرائیل، چونکە وڵاتەکەی پشتدەبەستێت بە کشتوکاڵ، کشتوکاڵیش پێویستی بە ئاوی زۆر هەیە. لە رۆژگاری ئەمڕۆدا نزیکەی ٢٠ ٪ ئاوی ئیسرائیل لە بەرزاییەکانی جۆلانەوە دێت.

داواکاری سووریا بۆ بەدەست هێنانەوەی تەواوی بەرزاییەکانی جۆلان وا دەکات ئەم وڵاتە کۆنتاکتی لەگەڵ دەریاچەی تەبەریە، کە ئیسرائیل یەك لەسەر سێی ئاوی هەبووی لەوێوە دەستدەکەوێت،



هەبێت. ئەگەر سووریا دەسەڵاتی بکەوێتە سەر کەناری رۆژهەڵاتی ئەم دەریاچەوە ئەوا دەتوانێت کاریگەری زۆر لەسەر گرنگترین سەرچاوەی ئاوی ئیسرائیل دابنێت. ئەگەر لایەنەکان چارەسەرێك بۆ ئەم گرفتە بدۆزنەوە ئەوا ئەگەری باش بۆ گەیشتن بە رێککەوتننامەیەکی ئاشتی دەرەخسێنرێت.

پێشنیارێك کە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە پێشکەشکراوە، ئەمریکا رۆڵی ناوبژیوانی لەم دانوستانانەدا دەبینێت، دەڵێت با ئیسرائیل کۆنترۆڵی بەسەر کەناری رۆژهەڵاتی دەریاچەکەدا هەبێت لە بەرامبەر پارچە زەوییەك لە شوێنێکی تر. ئیسرائیل ئاماژەی رازیبوونی نیشاندا بەڵام سووریا نارەزامەند بوو. جەنەراڵ یوری ساگۆی، کە سەرۆکایەتی دانوستانەکانی ئیسرائیل لەگەڵ سووریادا دەکات، دبێژێت: "ئیسرائیل ئامادەی دانەوەی هەموو ناوچەکانە ئەگەر لە بابەتی ئاو رازی بێت".

ئەگەری چارەسەرێك لەوانەیە گرێدانی ناکۆکی نێوان سووریا و تورکیا بێت لەمەڕ ئاوی رووباری فورات کە لە تورکیاوە بەرەو باشوور بۆ ناو خاکی سووریا دێت. ئەگەر تورکیا گەرەنتی زیاترکردنی رژانی ئاوی فورات بۆ سووریا بدات ئەوا دەکرێت ئەمە ببێتە ئەگەری ئەوەی کە سووریا رێگە بە ئیسرائیل بدات کۆنترۆڵی بەسەر ئاوی دەریاچەی تەبەریە بێنێتەوە. ئەمە مەحاڵ نییە ئەگەر مرۆڤ بڕوانێت کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە سەرۆك بیل

کلنتۆن دەخوازێت بە سەرکەوتنێکی گەورە لە بواری رامیاری دەرەوەدا کۆتایی بە ماوەی سەرۆکایەتی بهێنێت، لە توانایدا هەیە تورکیا بە پترکردنی رژانی ئاو بۆ ناو سووریا رازی بکات.

## دیمەنی دواڕۆژ – رێگر و ئەگەرەکان

بە شێوەیەکی گشتی دوو ئەگەری جیاواز بۆ چارەسەرکردنی گرفتی کەم ئاویی ناوچەکە هەیە، یەکەمیان پترکردنی بڕی ئاوی هەبووی ناوچەکەیە، دووهەمیان بونیادنانەوەی ئابوورییە بە مەبەستی کەمکردنەوەی پێویستی ئاو. هەردوو چارەسەرکردنەکە پشت بە زیادکردنی هاوکاری نێوان ئەو وڵاتانە دەبەستێت کە بە جۆرێك پشت بە ئاوی زێی ئوردن دەبەستن.

## پترکردنی بڕی ئاوی هەبوو

جۆرەها رێگە بۆ پترکردنی بڕی ئاوی ناوچەکە هەیە. یەك بیرۆکەی بایەخدار هەوڵدانی لابردنی شۆری ئاوی دەریای ناوەڕاستە لە رێگەی گرێدانیەوە بە دەریای مردوو. ئەو دانوستانە فرەلایەنانەی کە دەربارەی ئاوی ناوچەکە کراون، هەر وەکو پێشتر باسمانکرد، بوون بە هۆی دروستبوونی سەنتەرێکی لابردنی شۆریی ئاو لە عەمان. دیسان پێشنیاری دروستکردنی دامەزراوەی هاوبەش بۆ لابردنی شۆری ئاو لە ئیسرائیل، میسر، ئوردن و فەلەستین هەیە. ئەم دامەزراوانە وا پێدەچێت لە غەزە، حەیفا و کەنداوی عەقەبە دابنرێن.



خراپی ئەم ئەڵتەرناتیڤە بەرزی نرخی تێچوونی و قورساییەتی لەسەر ژینگە. لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئیسرائیل تاکە وڵاتی ناوچەکەیە کە بتوانێت نرخی لابردنی شۆری ئاو بدات. ئەو شارەزاییانەی کە ئەمڕۆ دەربارەی لابردنی شۆری ئاو هەن، ئەوە نیشاندەدەن کە زۆر باش دەکرێت ئەمە ببێت بە ئەڵتەرناتیڤێکی گونجاو لە فەراهەمکردنی بڕێکی کەم لە پێویستییەکانی ئاوی ماڵان، هەروەها بۆ ئەو دامەزراوە پیشەسازییانە کە توانای دانی ئەو نرخە بەرزەیان هەبێت. بە پێچەوانەوە، لە روانگەی داراییەوە زۆر ناگونجاوە پێدانی ئاوی شیرینکراو (شۆرلابراو) بۆ کشتوکاڵ، چونکە - بە بەراورد بۆ نموونە لەگەڵ پیشەسازی و پێویستی ماڵان — کشتوکاڵ پێویستی بە ئاوێکی زۆر هەیە، بە گوێرەی بڕی دانەوێڵەی بەرهەم هێنراو.

شێوازێکی تری پترکردنی بڕی ئاو زیادکردنی بەکارهێنانەوەی ئاوە. لەم بوارەدا ئیسرائیل تەکنەلۆژیای ئاڵۆزی پێشخستووە و پێشەنگی وڵاتانە. بیرۆکەکە وا دەڵێت کە کشتوکاڵ تەنها ئاوی بەکارهێنراوە وەربگرێت کە ئەمیش مانای پاشەکەوتکردنێکی ئاوی زۆر دەگەیەنێت.

ئاوی بەکارهێنراوە ئەو ئاوەیە کە لە لایەن ماڵان و پیشەسازییەوە بەکارهاتووە و دواتر لە رێگەی پرۆسەی بایۆلۆژی و کیمیاییەوە پاککراوەتەوە بۆ ئەوەی دواتر لە ئاودانی کەرتی کشتوکاڵ بەکاربهێنرێت. لە رێگەی ئاودانی کشتوکاڵ بە "ئاوی

بەکارهاتوو" دەکرێت بڕی ئاوی هەبوو گەلێك پتر بکرێت. دیسان ئەمەش تەکنیکێکی گران بەهایە و هەندێك دبێژن مەحاڵە پێویستییەکانی ئاوی کەرتی کشتوکاڵ دابینبکات. هەرچۆنێك بێت بەکارهێنانەوەی ئاوی ئەو ناوچانەی کە سیستەمی ئاوڕێژییان هەیە کارێکە دەکرێت بە ئەنجام بگەیەنرێت، وەك چۆن ئەمڕۆ بە شێوەیەکی بەربڵاو لە ئیسرائیلدا دەکرێت.

جگە لەوە ئیسرائیل تەکنەلۆژیای باڵای بۆ پاشەکەوتکردنی ئاو پێش خستووە بەڵام ئەو بڕە ئاوەی کە بەم شێوەیە پاشەکەوت دەکرێت، بۆ داپۆشینی پێویستییەکانی داهاتوو، بەس نییە.

هەروەها کاری ژینگەییش ڕێگایەکە بۆ زیادکردنی بڕی دەستکەوتووی ئاوی بەکەڵك، لەوانەیە تایبەتمەندی ئەمە لە دیدەیەکی دوارۆژیدا گرنگتر بێت، چونکە بەردەوامی لە "زیاد دەرهێنانی" ئاوی هەندێك چاوگەی ناوچەکە دەبێتە هۆی خراپکردنی چلۆنایەتی ئاوەکە، هەروەها کەمکردنەوەی دەستکەوتنی ئاوی بەکەڵك لە دوارۆژدا. بەهێزتر کردنی کاری ژینگەیی دەبێتە هۆی کەمتر پیسبوونی سروشت، ئەمیش لە لای خۆیەوە بڕی ئەو ئاوەی کە بەکەڵك دێت بۆ بەکارهێنان پتر دەکات.

شێوازێکی تری زیادکردنی بڕی ئاو هێنانی ئاوە لە ئەو وڵاتە نزیکانەی کە دەستڕەسی ئاوی زیاترن. تورکیا هەر لە ساڵی ١٩٨٧ وە پێشنیاری پێدانی ئاوی لە ڕێگەی "هێڵی بۆڕی ئاشتی" Peace



Pipe Line بۆ ئەو وڵاتە نزیکانەی کە کەم ئاون کرد، وەکو وڵاتەکانی دەوروبەری زێیی ئوردن و کەنداوی فارس. ئەم پڕۆژەیە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئاو بە ناو وڵاتی سووریاوە دەگەیەنرێت بە ئیسرائیل، ناوچەکانی فەلەستین و ئوردن. بە بیانووی ئەوەی، لە لایەن وڵاتان یان ئۆرگانی تیرۆریستییەوە، هێڵەکە دەکەوێتە بەر مەترسی تێکدان، پێشنیارەکە کاری لەسەر نەکرا . هەڵبەتە ئەمەش ئەگەر دەدات بە تورکیا کە ڕۆچوونی ئاوەکە دابخات. جگە لەمەش ئەمە ئەڵتەرناتیڤێکی گران بەهایە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٩، کاتێك کەم ئاویی بەهۆی وشکانی زۆرەوە ناوچەکەی شپرزە کرد، و سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ دا هەمان بیرۆکە سەریهەڵدایەوە و هەریەك لە ئیسرائیل و ئوردن ئارەزوومەندییان بۆ کڕینی ئاو لە تورکیا نیشاندا.

تەنانەت یەکێك لە بیرۆکەکان گواستنەوەی ئاوە لە ڕێگەی هێڵی گەورەوە بە ناو سووریاوە بۆ ئیسرائیل و دواتریش بۆ ئوردن. ئەمڕۆ ئەگەری سەرکەوتنی ئەم بیرۆکەیە باشترە چونکە پرۆسەی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و سووریا لە هەموو ساڵەکانی پێشووتر لە برەو تردایە.

بیرۆکەی تر لە گواستنەوەی ئاو بەهۆی تەنکەرە یان تانکی گەورەی لە پلاستیك دروستکراوە کە بە دوای پاپۆڕەوە لە تورکیاوە

بۆ بەندەری حەیفا لە باکووری ئیسرائیل رابکێشرێت. ماوەتەوە بزانین کام لە ئەم ئەڵتەرناتیڤانە لە روانگەی ئابوورییەوە گونجاوە.

## کەمکردنەوەی پێویستی ئاو

مەترسییەکی گەورە لەوەی ئێمە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دوای ئەوەی هەموو ئەگەرەکانی پترکردنی ئاومان بەکارهێنا و بەهۆی تەکنەلۆژییەوە گەیشتینە باشترین شێوازی ئاو بەکارهێنان، هێشتا هەر کەم ئاو بین. دەبێت چی بکرێت بۆ رێگە گرتن لە ئەم گرفتە؟ توێژەرەوەکان دەڵێن دەبێت مرۆڤ لە ئەم رەوشەدا بگاتە ئاستی "چوستی چوارچێوەکراو" Allocative Effecincy ئەمیش واتای هەوڵدانە بۆ سوود وەرگرتن بە ئابوورییانەترین شێواز لە هەر دڵۆپە ئاوێك کە کۆمەڵ وەریدەگرێت.

ئەمڕۆ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کشتوکاڵ ئەو کالاّ ژیانییەیە کە زۆرترین بڕی ئاو بەکاردەهێنێت. کشتوکاڵ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیادا رێژەی ٨٨٪ ئەو سەرچاوە ئاوییانە بەکار دەهێنێت کە لە بەنداو و جۆرەکانی تری حەوز دان بە بەراورد لەگەڵ رێژەی جیهانی کە ٦٩٪ یە. بە گوێرەی دەستکەوتە ئابوورییەکەی، کەرتی کشتوکاڵ بڕێکی هێجگار ئاو دەبات. کشتوکاڵ لە ئیسرائیل نزیکەی لە ٧٠٪ هەموو ئاوی هەبوو دەبات بەڵام ئەمە تەنها ٣٪ سەرجەمی بەرهەمی نیشتمانی GNP Gross



National Product پێکدەهێنێت. کشتوکاڵ لە کەناری رۆژئاوا لە نێوان ٦٠-٧٠٪ هەموو ئاوی هەبوو دەبات لە کاتێکدا تۆزێك سەرووی ٢٠٪ GNP پێکدەهێنێت. تێکڕای ٩٣٪ GNP ئوردن لەو کەرتانە پەیدا دەبێت کە تەنها ٥٪ ئاوی ئوردن بەکاردەهێنێت. لە ئیسرائیل تەنها ٣٪ هێزی کار خەریکی کاری کشتوکاڵە بەڵام لە ناوچەکانی فەلەستین، ئوردن و سووریا بەشێکی بەرچاوی دانیشتوان خەریکی کاری کشتوکاڵێن (لە نێوان ١٠-٢٥٪).

راستییەکانی دوای ئەم ژمارانە ئەوە نیشان دەدەن کە چارەسەرکردنی گرفتی ئاو، پێویستی بە بونیادنانەوەی پەیکەری کۆمەڵایەتی و ئابووری هەیە. مەحاڵە ئەم وڵاتانە پێویستی خواردەمەنی خۆیان دابینبکەن، بە پێچەوانەوە ئەوان دەبێت هەوڵی هێنانی ئەو دانەوێڵانە بدەن، کە رواندنیان پێویستی بە بڕە ئاوێکی زۆر هەیە. ئاساییانە مرۆڤ بە ئەم جۆرە هاوردنانە دەڵێت "هاوچەشنە ئاو" virtuell water. هاوچەشنە ئاو ئەو جۆرە ئاوەیە کە گرێدراوی دانەوێڵەیەکە و رواندنی پێویستی بە بڕێکی زۆر ئاو هەیە. ئاساییانە مرۆڤ دبێژێت کە یەك تەن خۆراکی هاوردە بەرامبەر بە نزیکەی یەك هەزار مەتر سێجا هاوچەشنە ئاو دەوەستێت.

ستراتیژی کڕینی دانەوێڵە لەبری رواندنی بە چەندین گرفتەوە بەندە. ئەو ئاوەی کە بەم جۆرە لە کەرتی کشتوکاڵ دەسەندرێت و

دەدرێت بە کەرتی پیشەسازی و خزمەتگوزاری، دەبێت لە نێو ئەو پیشەسازی و کۆمپانیا خزمەتگوزارییانە بهێنرێتە بەکارهێنان کە توانای ململانێیان لە بازاڕی جیهانیدا هەبێت. جێی گومانە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئوردن و سووریا و خەڵکی فەلەستین بتوانن یان لە ماوەیەکی کورتدا کارێکی لە ئەم جۆرە بکەن. لە لایەکی ترەوە ئیسرائیل رێگایەکی درێژی ئەم پرۆسەیەی بڕیوە، ئەمیش پێش هەموو تشتێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گەشەسەندنانەی کە لە بوارەکانی تەکنەلۆژیای بەرزەوە کۆمپانیاکانی ئەم وڵاتە بەدەستی هێناوە. تەنانەت ئیسرائیلیش لە داهاتوودا پێویستی بە گواستنەوەی ئاوە لە کەرتی کشتوکاڵەوە بۆ هەندێك کەرتی تر کە پێویستی بە ئاوی کەمتر هەیە.

گرفتێکی تری ئەم ستراتیژییە دژواری پەیداکردنی کارە بۆ ئەوانەی کە چیتر لە چوارچێوەی کەرتی کشتوکاڵدا کار ناکەن. رووبەڕووبوونەکە گەلێك دژوارترە ئەگەر مرۆڤ بیر لەوە بکاتەوە کە ناکرێت هەلی کاری تازە تەنها بەو کەسانە بدرێت کە وازیان لە کاری کشتوکاڵی هێناوە بەڵکو دەبێت هەلی کاری نوێ بە پێی زۆربوونی خێرایی دانیشتوان بخولقێنرێت.

گرفتێکی تری خەڵکی ئەم وڵاتانە ئەوەیە کە وای دەخەمڵێنن کە کشتوکاڵ بنچینەی ئابووریی نەتەوەییە، چونکە پێشتر بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ وابووە. بۆیە ئاستەنگە بۆ رامیارسازەکان بونیادنانەوەی گەورە



ئەنجامبدەن، ئەگەر تشتێکی لە ئەم جۆرە بکەن ئەوا ئەگەرێکی زۆر هەیە کە بۆچوونی زۆربەی جەماوەر دژ بە خۆیان بکەن. لە ئاسۆی ڕووندا وا دیارە تەنها ئەم ستراتیژییە هەیە کە بە گوڕەوە بتوانێت رووبەڕووی ئەو گرفتانە بێتەوە کە کەم ئاویی و پتربوونی دانیشتوان لەگەڵ خۆیاندا دەیانهێنن. گومانی زۆر دەکرێت کە ئەم گرفتانە گۆڕانکاری زۆر لەگەڵ خۆیاندا بهێنن کە لەوانەیە ببێتە هۆکاری پەیدابوونی جۆرەها کێشەی کۆمەڵایەتی، کە ئەمیش روانگەیەکی ترە بۆ سەیرکردنی کێشەی ئاو. لە راستیدا مرۆڤ نازانێت ئەم کێشانە بە چ شێوەیەك لە داهاتوودا دەردەکەون، بەڵام ئاشکرایە کە کۆمەڵگاکان دەکەونە ژێر فشارێکی گەورەی کۆمەڵایەتییەوە.

شێوازێکی تر، هەرچەندە پەیوەستە بەوەی پێشووتر، کەمکردنەوەی داواکارییە بۆ ئاو بە هۆی دانی ئاو بە پێی نرخی بازاڕ، دەمەوێت بێژم وەرگرتنی پارە لە بەرامبەر نرخی راستەقینەی بەرهەمهێنان و بەدەستهێنانی ئاودا. تشتی لە ئەم جۆرە لە هیچ وڵاتێکی ناوچەکە روونادات، بە پێچەوانەوە ئاو تاکو رادەیەکی زۆر بە خۆڕاییە، بە تایبەتی بۆ کەرتی کشتوکاڵ. لە داب و نەریتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئاو داهاتێکی بەلاشە کە دەبێت هەموو کەس وەریبگرێت. گۆڕینی ئەم بڕوایەش دەکرێت زۆر ئاستەم بێت. ئەگەر نرخی بازاڕ لەسەر ئاو دابنرێت ئەوا قازانج ناکرێت لە ناردنە دەرەوەی دانەوێڵەیەك کە بۆ رواندنی پێویستی بە بڕە ئاوێکی زۆر هەیە. ئەمەش دەکرێت ببێتە هۆکاری "پەکخستنی" کشتوکاڵ.

## کورتەی باس و ئەنجامەکان

بابەتی ئاو گرفتێکە، بەردەوامیش دەبێت وەکو گرفتێك، بۆ وڵاتانی دەوروبەری زێی ئوردن. ئاو بەشێکی تێکەڵبووی ئایدۆلۆژی و ئاسایشی نەتەوەیی و رامیاری ناوخۆی ئەم وڵاتانەیە. بینینی چارەسەرکردنی گرفتی کەم ئاویی ناوچەکە، بەبێ هاوکاری ناوچەیی بۆ کێشەکانی ئەو سەرچاوە ئاوە هاوبەشانە، ئەستەمە. بۆیە بابەتی ئاو گرێدراوی ئەو پێشکەوتنانەیە کە لە چوارچێوەی پرۆسەی ئاشتیدا روودەدەن. ئەگەر پێشکەوتن لە پرۆسەی ئاشتیدا روویدات ئەوا پێشکەوتن لە پرسی ئاویشدا روودەدات. مێژوو ئەوەی سەلماندووە کە هاوکاری نێوان وڵاتان لە بوارێکدا دەبێتە هۆکاری ئاسانکردنی هاوکاری لە بوارەکانی تریشدا. لەبەر ئەوەی لەم ناوچەیەدا تا رادەیەك هاوکارییەکی دامەزراو لە چۆنیەتی مامڵەکردنی ئاوی ناوچەکە هەیە، کەواتە دەکرێت ئەمە بکرێتە هاندەرێك بۆ پێشخستنی پرۆسەی ئاشتی.

ناوچەکانی دەوروبەری زێی ئوردن وڵاتەکانی ئیسرائیل و ئوردن و ناوچەکانی فەلەستین و سووریا لە رێگەی تۆڕێکی ئاڵۆز، کە زنجیرەیەك کێڵگە وەکو ژینگە، ئابووری، رامیاری و ئاسایش پێکدەهێنێت، بە یەکەوە گرێدەدات. کردەوەی یەکلایەنەی وڵاتێك کە توانای کارکردنە سەر رۆچوونی یان چڵۆنایەتی ئاوی زێی ئوردنی لەسەر وڵاتێکی تر، یان چەند وڵاتێکی تر، هەبێت، کە پشت بەم ئاوە دەبەستێت/- دەبەستن، ئەگەری ئەنجامی زۆر هەستیاری لێدەبێتەوە.



کردەوەی وڵاتێکی ناوچەی زێیەکە بەبێ رەزامەندی وڵاتانی تر، وەکو پێشتر، لەوانەیە ببێتە هۆکاری دروستبوونی کێشەی پڕ مەترسیدار لە ناوچەکە. بۆ نموونە هۆکاری شەڕی شەش رۆژەی **١٩٦٧** لەوەی کە ئیسرائیل پەلاماری بەنداوەکانی سووریا و ئوردنی دا لە ئەوە سەرچاوەی گرتبوو کە ئەم بەنداوانە هەڕەشەی کەمکردنەوەی ئاویان لەسەر ئیسرائیل دەکرد. بەم شێوەیە، ناوچەی هاوبەشی ئەم زێیە یەکەیەکە، کە هەموو شتەکان گرێدراوی یەکە، لە ئەوێ هەموو پشت دەبەستێت بە هەموو، لە ئەوێ بابەتی سەرچاوەکانی ئاو لە زۆر روانگەوە گرێدراوە بە کرۆکی ئاسایشی وڵاتەکانەوە. ئەمەش تایبەتمەندییەکی ئاشکرای ناوچەکەیە کە کەم ئاویی راستییەکی حاشا هەڵنەگرە.

وڵاتەکانی ناوچەی رۆچوونی ئاوی زێی ئوردن، هەر لە مێژە هاوکاری وەکو یارییەك دەبینن - بردنەوەی لایەك وەکو دۆڕاندنی لایەکی تر دەبینن، دەکرێت دۆخی ئاوی خۆیان باش بکەن. توێژینەوە ئەوەی سەلماندووە کە لە هاوکاری رامیاریی ئاوییدا هەموو لایەك براوەن. نموونەی هاوکاری لە نێوان وڵاتەکانی دەوروبەری زێی ئوردن هەن، هاوکاری نێوان ئیسرائیل و ئوردن دەکرێت وەکو پێشەنگ سەیربکرێت.

ئەگەری زۆر باش بۆ زیادکردنی هاوکاری تەکنەلۆژی لە نێوان ئیسرائیل، لە لایەك، و ئوردن و ناوچەکانی فەلەستین و سووریا، لە لایەکی تر، هەیە. ئەمیش لەوانەیە ببێتە هۆی باشتربوونێکی بەرچاو لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئاو، چونکە لە بواری ئەم جۆرە تەکنیکەدا، ئیسرائیل پێشەنگی وڵاتانە.

*<u>بە کورتی</u>* تەنانەت لە داهاتووشدا تاکو ئەو کاتەی بڕی ئاوی هەبووی ناوچەکە دادپەروەرانە بەسەر خەڵکانی ناوچەکەدا دابەش نەکرێت، ئاو وەکو سەرچاوەی کێشە لە نێوان، تەنانەت لە نێوخۆی، وڵاتانیشدا دەمێنێتەوە. بەردەوامی لە دابەشکردنی نایەکسانی بڕی ئاوی هەبووی ناوچەی ڕۆچوونی ئاوی زێی ئوردن، وەکو ئەمڕۆ، کە ئیسرائیل **٣-٤** جار ئاو پتر بۆ هەر کەسێك لە ساڵێکدا بەکاردەهێنێت بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی فەلەستینی دراوسێیدا، دەبێتە هۆکاری بەردەوامی ئاژاوە و خولقاندنی ناتەبایی لە نێوان خەڵك و وڵاتاندا.

پتر لەمە، کەس لە ئەوە دڵنیا نییە کە دابەشکردنی یەکسانی ئاوی هەبووی ناوچەی ڕۆچوونی ئاوی زێی ئوردن گەرانتی نەهاتنەدی کێشەی تری بکات. گەورەترین بەربەرەکانێی ئەم دە ساڵانەی داهاتوو زیاتر دەربارەی ئەوە دەبێت کە چۆن ئەم وڵاتانە بتوانن خۆیان لەگەڵ کەم ئاویی بەردەوامدا بگونجێنن. هاوتەریب لەگەڵ هەوڵدان بۆ دابەشکردنی یەکسانی ئاو، دەبێت بەڕێوبەرایەتی فەلەستین و ئوردن و سووریا کاربکەن بۆ ئەوەی کۆمەڵگاکانیان بتوانن لەگەڵ کەم ئاویی بەردەوامدا خۆیان بگونجێنن. خۆگونجاندن بۆ ئاستی "چوستی چوارچێوەکراو" (بنوارە ل. ٣٦) باشترین ئەگەری لەبارە بۆ سەرکەوتن بەسەر کێشەی کەم ئاوییدا، ئەگەر وڵاتەکانی ناوچەکە بە تەبایی پێکڤە بژین، بە جۆرێك لەوێ هاوکاری لە بری ناتەبایی داب بێت.

لینشوێپینگ، مارس ٢٠٠٠



## سەرچاوەکان


Allan, Tony, *Israel and Water in the Framework of the Arab-Israel Conflict*. London 1999

Elhance, Arun P, *Hydropolitics in the 3rd World.* Washington, D.C. 1999

Farinelli, Xavier, H, *Freshwater conflicts in the Jordan River Basin*. Genève 1997

Gleick, Peter, "Water and conflict" i *International Security,* vol. 18, nr. 1, 1993

Isaac, Jad, "Core Issues of the Palestinian-Israeli Water Dispute", i Spillman, K. och Bächler, G (red.) *Environmental Crisis: Regional Conflicts and Ways of Cooperation.* Zürich 1995

Jones, Peter och Jägerskog, Anders, "The Middle East", *SIPRI Yearbook 1999*. Oxford 1999

Libiszewski, Stephan, "International Conflicts over Freshwater Resources" i Suliman, M. (red.), *Ecology, Politics and Violent Conflict.* London och .New York 1999

Lindholm Schulz, Helena, “Det livsviktiga vattnet” i Svalander A. och Elmqvist, K-A (red.) *Drömmen om fred.* Lund 1997

Lundqvist, Jan m fl, ”New Dimensions in Water Security – Water, Society and Eco System Services in the 21 st Century” i *FAO Report.* New York 2000

Ohlsson, Leif, *Environment, Scarcity and Conflict – A study of Malthusian Concerns.* Göteborg 1999

Peters, Joel, *Pathways to Peace – The Multilateral Arab – Israeli peace Talks.* London 1996

Rouyer, Alvin R. “The Water Issue in the Palestinian-Israeli Peace Process”, *Survival,* vol. 39, nr. 2, 1997

The Hashemite Kingdom of Jordan, Ministry of Water and Irrigation, *Water Sector Investment .Program 1997-2011.* Amman 1997










**ئەندەرس یاگەرسکوگ**

دکتۆرای لە بابەتی ئاو لە زانکۆی لینشوێپینگ هەیە. مەیدانی سەرەکی توێژینەوەکانی مامەڵەکردنی نێونەتەوەییانە و گرفتی ئاوە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەو پێشتر لە ( Stockholms Internationella fredsforskningsinstitut (SIPRI)، واتە ئەنیستیتوی توێژینەوەی ئاشتی نێودەوڵەتی لە ستۆکهۆڵم لە بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کاریکردووە، هەروەها لە ئۆرشەلیم/قودس ژیاوە و خوێندوویەتی. ئەو ئێستا سەرۆکی پرۆژەکانە لە(Stockholm International Water Institute (SIWI) لە سوید.

**غازی عەلی خورشید**

بەکالۆریۆس لە زانستی ئەندازەیی/ مامۆستایی ئامادە پیشەیییەکان، زانکۆی تەکنەلۆژی بەغدا/ عێراق ١٩٩١. ماجستێر لە زانستی زمان لە زانکۆی ستۆکهۆڵم سوید ٢٠٠٧.